


---

**... تۆ دەبێت بژی.**

**—**

**تۆ دەبێت بژیت تا گوڵەکەن بمێنن**

**... تۆ دەبێتت بژیت تا من بمێنم**

**بژی تا دڵ بێ ئیش نەبێت**

**تا دڵ بەتاڵە لێ نەدات**

**تۆ پێویستە دەست بەسەری هەورەکانا بهێنی**

، دڵی گوڵەکان ڕابگری ، نازی ئەستێرەکەن هەڵ بگری ، نیگا بۆ مانگ بکەی نەبادا دڵ گران بێ

، تۆ پێویسە بژیت تا من بۆت بنوسم

، میهرەبانیت بکە ملوانکەیەک بیکە گەردنی مانگ

، سۆزت بکە ئەڵقەیەک نیشانی ئەوانی بدە من کە هاتم بیکە پەنجەکانم

تۆ پێویستە بژیت تا دنیا هەمیشە بەهار بێت

تا خامی سپی ڕەنگێکی دی بپۆشێ

، تا دار قەیسیەکان لە کاتی خۆیاندا گوڵ بکەن

تۆ بژی تا لە هەمو بڵند گۆی کڵێساو مزگەوتەکانەوە

، ستایشی تۆ دەکەن

، تا ئینجیل بە دەستکاریەکی ئادەمیەوە ناوی تۆی تێ دەکرێ

، تا تەوراتو زەبورەکان بەرگی نوێ دەپۆشن

، تۆ پێویستە بژیت تا ئاور نەگرێت ئەو دڵنای بونەتە مەشخەڵی ڕۆژی ڕوناک بۆتۆو تۆ نایان بینی

تۆ سادە ترین نێو ئەم سەدەیەی تۆ دڵ گەرمتینی

نێو ئەم گشت دڵەی

تکایە تۆ بژی

، تا من دڵم نەشکێ

بچۆرە ژێر ئەو دار گێلاسانەی کە وا خەریکە

، لە بەر دەچنەوە تۆ دەبێت دڵیان ڕابگی نە بادا دڵیان بشکێ

تۆ دەبێت بژیت تا باخەوان لە باخ بێتەوە کە چەند سەدەکەیە دیار نیە ، دەبێت هەبیت تا لاو لاوەکانی تەمان ، ڕوو لە زۆری بکەن

تۆ گەر هەبویت من گەر نەبوم ئازیز گیان

خۆت بە ژماردنی مانگەوە سەرقاڵ بکە کە تەواو بوی وەک شەو شادێکی من بیهێنە پێش چاوت

برۆ ... برۆ ژێر جێگەتو چاوەکانت دەخە گەر زانیت

دڵ تەنگی هێرش دێنێ لێی ڕامەکە تەنها برۆ مانگ بژمێرە لە شەوێکی تەڵخوو تەمدا مانگ زیاد دەکات

،.. تۆ بیژمێرە

تۆ دەبێت بژیت تا پەپولە ڕەنگی خۆی نەگۆڕێ

تا ئاسمانی شین سوور هەڵ نەگەڕێت

... تا نەورەسەکان ڕەنگیان نەگۆڕێ

ئەی مانگ هێندە خۆتی پێ مەشوبهێنە ئاخر

.. لە چاو دەچی بێ ڕەنگ دەبیت

... لەم ئاسمانی گەلاوێژەدا سەگێکی برسی بە مثلی دەرد بۆ بێ تۆیم دەڕوانێ ، لێی هەڵ مەیە

، تۆ .... ئەرێهـ تۆ پێویستە دەست بەسەری پشیلەکاندا بهێنی دڵیان ڕابگریت

تا حاکم مەحکوم بێ ، تا قەلەباچکەی سپی ئیدی دز نەبێت ، تا حوکمی دارستان شێرو چەقەڵی برسی

... نەیبات بەڕێوە با مریشکو مشکە بەستەزمانەکان بیبەن بەڕێوە

تۆ پێویستە بژیت تا جەهەنمێک بونی نەبێت

.. تا ناخۆشیەک ملی شکاویمان ڕوو تێ نەکات

، ئەی مانگی بەنازم ناترسی لە تاریکی شەودا بخنکێیت .. دەخنکێیت ... هێندە بێ ئاگا مەبە

... تاعونێکی ڕەش دەوری تەنیوی بە نوری میثالی خۆت شەقار شەقاری بکە

تۆ بژی ئازیزی من با هێندە دڵ بێ وجود نەبێ

با ئەم سینەیە هێندە دەهۆڵی بێ ئومێدی نەکوتێ

، با ئەم مێشکە پوچە سەرقاڵی شتێکی دی نەبێت

تۆ بژی تا هەمیشە دنیا بەڕوماندا پێبکەنێ

تۆ بژی تا من دەژیم

".. تۆ بژی تا لەبیر دەچمەوە

... لەم تەمو مژەدە چاوەکانم دەنوقێنم وەک بکوژێکی وێڵ بەشوێن ڕوناکیدا وێڵم

، دەستم بگرە .... دەستم بگرە من لە نێو ئەم لیخاو چڵکاوەدا دەر بهێنە لەنێو ئەم تاریکیەدا دەر بهێنە

مەڵاسم دە لەم هەموو ئادەمیە کەسێکی خەتا کارم

".. بم شارەوە لەم هەموو چاوە

هێندە باسی چرپەی ئەستێرەکانم بۆ مەکە

من تۆ فانێک لە گەرومدا وێڵە ... با دانەکات

.... ئەی مانگی بە نازم هێندە خۆت نیشانی بەهار مەدە .. با وا هەست نەکات لەو جوانتر هەیە

با وا هەست نەکات خودا زوڵمی لێ کردوە

.. با وا هەست نەکات ئیدی خەڵکی لەیادی دەکەن

من داڵێکی بەد خوم

بە دارەکەی دەستم ڕاوی سەگەکان دەنێم

پشیلەکان بێ زار دەکەم

.. بەرد دەگرمە پاساریەکان ..، نەفرەت لە گۆزە کەران دەگرم

گیرفانەکانم پڕن لە یادەوەریەکانی منداڵیم

دڵیشم پڕە لە تۆ

بۆ ناپرسی کوای خۆت

من لە کن ئەو ئاسنگەرە چاو شینە بێ رەحمە

.... بەجێ ماوم کە تۆم تێدا دیت

تۆ دەبێت بژیت تا هەمیشە تۆ بم

..تۆ پێویستە بژیت تا من کەسێک هەبێت بۆی بژیم

ئەی خونچەی چوار وەرزەی لەنێو ئەو دڕکانەدا

دەخنکێیت .. دەخنکێت .. تۆ مەڵێ من بە ئاگام

.. لەنێو ئەم هەورە ڕەشە ئازیزی من دەخنکێت هێندە بێ ئاگاش مەبە

تۆ پێویستە بژیت تا  مانگ نەشوبهێن بە گشت کەس ..، تۆ سەیری ئەو ڕوخسار خوێنەرەوانە مەکە

، کە بۆ دوو پولی قەڵب بەختی قەڵبت بۆ دێنن

... تۆ مەڕۆ با دڵ نەڕوات

بەیانیەک دێت بەخەمێکی قوڵی سەر لێ شێواوە

هەڵدەستم و دەنگی دەرگا دێت

.. بەیانیەک دێ وەختێ پرشنگی هەتاو دەکەوێتە سەرت من بە نائومێدیەکی زۆرەوە هەڵدەستمەوە

دەنگی دەرگا دێ

بەیانیەو لەپێش جریوە جریوی چۆلەکەوە کەسێک

.. زوو تر هەڵدەستێ چاوەڕێ دەرگا دەکات

.. گوێم لێیە لە دەنگی دەرگاو خیرە کردنەوەیم لە بێ تۆی نیە

". من هێندە بێ ئاگام کە تەنها وەهمێکەو من ئێستا دەرگا لە چاوەڕوانی هاتنتا داناخەم

سەیر کە من سەرێکم پێ دەر ناکرێ لەم هەموو

.. نەهاتنە

تۆ پێویستە بژیت

تۆلە خونچەی تازە پشکوت ناسکتری ئازیز

.. هەر بۆیە دەبێت بژیت تا خەلکی شێوەی گوڵ لەیاد نەکەن چاویان بێ بەش نەبێ لە جوانی

کەسم تۆ بۆ هێندە دڵی خۆت تەنگ دەکەی

بۆ هێندە لە جوانی ڕادەکەیت

!... بۆ وا تێراماون لێت

بژی تا خونچە بپوشکێت تا یاسەمینەکانی سەحەر

بادەیەک شیرنتر لە لێوەک بدۆزنەوە

تا ڕوناکی کەیت ئەم شەوە تاریکانە

تۆ پێویستە بژیت تا ڕۆژی مەحشەر

.. تا دواین نەفەسی زەوی تا دوگیان بونی مانگ

بیرتە ئەو ڕۆژە ڕەشانەی خۆزگەم وەک ئاهێک دەخواست ... ئاهێک ڕەشتر بو لەو ڕوانەی لە ناوچەونیان
" نوسرابوو " خەتاکار

ئاهــ

... ئێستاکە من هەمو تۆ هەیت ئاهەکانم گشتی بون بە خۆزگەو یاخی بونو بونە ڕاستی

.. بژی با خۆزگە بخوازم بژی با دڵم نەشکێ

تۆ چاو دامەخە نازی پەپولە هەڵ بگرە

خۆت پیشانی پاساریەکان بدە بێزارین لەو

! ... ئاوازە دوبارانە

.. تۆ دڵی ئەو مێلورانە ڕابگرە کە دەیانەوێ یاریت لەگەڵ بکەنو تۆ لێیان ڕادەکەی

تۆپێویستە بژیت تا شیوەنو عاشوراکان لەیاد دەچنەوە .. تۆ بژی تا ئەو دارە وشک هەڵاتوە

.. پەیمانی گەڵای تازەمان دەداتێ

هەڵدێم

لەو یاداشتانەی بۆ تۆ دەنوسرانو منیان پشت گوێ دەخست .. لەو دڵە بێ چارانەی جەهەنەمی خەلقیان
".. خولقاند .. لەو دزە بێ ئابڕوانەی وا یاخی دەبن

ئەو شوێنە چاڵو شەقار شەقارانەم خۆشدەوێن

.. کە بارانی موحیبەت دروستی کردون

خودایە

ئیدی با باران نەبارێ  دڵی ئەم هەمو دەردەم وە

.. پێ ڕاناگیرێ

.. خودایە خۆر کوێر بێ کە چاو بە تۆ دەداخات

ئەو دار شۆرەبیانە وشک بن کە نە لەهاتاوا یارمەتی دەدەنو نە لە باراندا .. ئاخر تۆ چکارەی

بژی با کوێر بن ئەو چاوانەی بە ئاستەم هەڵ دێن

..... بژی کەتۆ هیوای ژیانی

بارانەو دیسان من ترسێ دام دەگرێ

ئازیز باران بێ مروەتە چەترت بیر نەچێ نەبادا

، تەر بی ، خودایە باران کوێر بێ گەر نیازی خراپ بێ

تۆ پێویستە هەمیشە باش بی تا دنیا

، یاخی نەبێو بیر لە شوێن گرەوەیەک نەکات بۆت

". تۆ پێویستە هەمیشە باش ئیدی کە ئەمە ئارەزومە

کە کەسێکی بە نازو عیشوە دەبینم

کە پێەکانی لە باتی بە عەرزدا بنێ دەینێتە عاسمان

شەرم دەم گرێت دەست بە سمێڵەکانما دێنم

دەمهەوێ بڵێم نـــــــــــــــــــــــــــــــــــــا

ئیدی بەسیکە لەدوای ئەو گشت شتێ تاوانەو

... مژدەی نەسیمی دۆزەخی پێ بڵێم

تۆ کە هیچ قسەیەک ناکەی من هەوڵ لە تێگەیشتنی

بێ دەنگیت دەدەم .. تۆ کە دەڵێ نا من حەز دەکەم

.. وشەیەکی بەڵێ نەبیستم

.، بەڵێ تۆ پێویستە بژیت ئیدی کە چارەیەک نیە

!.. ئەو کاتانەی کەنیت بویەکی نەبوم

ئەو کاتانەی کە نیت سەر بۆ هەموو کێشەیەک دەبەم

، پیاسە بە نێو ژورەکانی تەمەنمدا دەکەم

، وەک عەسکەرێکی فیرار هەڵدێم لە ڕاستی

وەک تەونێک بەدەم (با) وە خۆم دەکێشم بەتاریکیدا ، وەک ئەو دارە ڕەنگ زەرد هاڵهاتوە وام کە وا بۆ .. دیداری باران وا گیان دەدا

بێ تۆیم وەک ئو فیشەکانە وان ک خۆیانم لێ لانادەن گشتیان ئاسەوار جێ دەهێڵن گشتیان

.... من لە ناو دەبەن

.. بژی با دنیا هەمیشە جوان بێ

تۆ پێویستە بژیت

.. با ئەم جەنگە ببڕێتەوە تا خامی سپی دەکەین بە ئاڵاو خۆمان بەدەستەوە دەدەین

تا دەنگی دایکێکی شەهید دەبیسترێ هاوار دەکات

ئێمە خۆمان دا بەدەستەوە ئێمە بردمانەوە چون تۆ هەیت چون تۆ باشی چون تۆ نە حەزت لە جەنگە

.... نە لە شکست ، بژی تا جوانی لەیاد نەچێ

بەراستی ئێستاکە خراپ بیر کردنت وەرەسی کردوم وەک ئەو قرژاڵە وام کە ئەو نەورەسە تەنگی پێ هەڵ ،چنیومو ڕێگایەک نیە خۆمی لێ قوتار کەم

وەرە با ئیدی برۆین

فەرامۆشیان کەین ئەو هەمو دڵو تیرەی وا بۆ ئێمە

کێشراون با ئازادی کەین ئەو خەیاڵانەی هەرگیز لەیاد ناچنەوە ، وەرە با وەک دوو کەسی سادە

... بەم جەن جاڵیە پێ بکەین

تۆ بژی تا من گشت کەس بە گەدا نەزانم

تا وەهمێکی تر نەخوڵقێ ، تا ترسێکی دی نەچێنرێ

"".. تا دڵ نەکا عبور

، وەرە بێزارم لەم جێناوە تاکانە

وەرە با ببینە ئێمە با لەیادی کەین ڕۆژانی زوو

، بۆ سبەینێیانێ بژین کە دوێنێ دەمان ویست وابین

تۆ دەبێت بژی تا لەیادتت کات تەمی دارستان

.. تا بیرت بچێتەوە ڕوخساری گورگەکان

دەگەڕێینەوە بۆ لای تابوتەکان نـــا

بۆ ژێر دار قەیسیەکان وەک منداڵێکی فێڵزان

خۆم لەژێر دار قەیسیەکاندا حەشار دەدەم

دەشترسم کە چ بەت بەختیەک بوو کە هەرگیز تۆ

منت پێ نە دەدۆزرایەوە ، ڕەنگە ئێستا واش نەبێ کە تۆ گشت شوێنەکانم پێ دەزانی .. گرینۆکمو بیانو
. دەگرم ، لە منداڵی ڕادەکەم بەرەو لای تۆ هەڵ دێم

تۆ کە گشت هیوای منی بێ هیوام مەکە

کە تۆ پێویستە شاژنی من بی خۆت لە نەزانی مەدە

تۆ بژی کە دنیا بە تۆوە جوانە

کە من بە بونی تۆوە هەم

کە مانگ لەبەر تۆ هەڵ دێت

کە دڵ تانها بەهانەی لێدانی تۆیت

ئەی مانگی بەنازم باقەشەنگ ترین مرۆڤ دەست گیرانم بێ باجوانترین ئادەمی خودا هاوسەرم بێ

بامن ناز بکەم بەسەر بێ تۆیدا

... با من بۆنی تۆم لێ بێ

، بە وێنەکانت بڵێ بە چاوی پڕ گلەی هێندە لێم نەڕوانن

.. بە دڵت بڵێ بکا یادم کە بەیادی تۆ شادم

وێنەکانت لە سوچێکی تابوتەکەم بەگیر دەهێنم

**حاشاریان دەدەم**

**.. با ڕوخسارتم لە یاد نەچێ**

**تۆ بژی با خودا دڵ نەشکێنێ**

**با نائومێدیەکان زەفەرم پێ نەبەن**

**با هابیلو قابیلێکی دی نەخولقێ**

**... با دنیا هێندەش خامۆش نەبێ**

**من دەزانم ئەمشەو لە خەو رادەپەڕێم**

**، باوەش دەکەم بە بێ تۆیداو خۆم لە گێلی دەدەم**

**،وەک نەفامێک دەمهەوێ فام بکەمو خۆم گێل دەکەم**

**وەک بکەرێکی ون بەشوێن کرداردا دەگەڕێم**

**.. وەک تەونێک خۆم دەکێشم بەم بێ تۆییەدا**

**تۆ بژی**

**تۆ بژی با من شکۆی پەپولەکان بزانم**

**.. تۆ لام بە تا هێندە تانەم تێ نەگرن**

**تۆ نازی ئەو گوڵانە هەڵ بگرە کەدڵیان پێت خۆشە**

**من ئێستا گەورە بومو بە کۆڵانەکاندا تێ دەپەڕمو**

**سڵاو لە هیچ کەس ناکەم**

**، تۆ گەورە بویتو ناز بەسەر کۆڵانەکاندە دەکەیت**

**چ ئومێدەکە وەختێ بیر دەکەمەوە تۆ هەیتو**

**... لام نی**

**چ دڵ تەنگیەکە کاتێ تۆم دەوێیتوو**

**... لام نی**

**ئازیزم ئێستا باشیت لەم دڵ رەقیەی شەودا**

**... تاریکی زەفەرت پێ ناباتوو بە وەهمە مێشک پوچەکانیەوە دڵت تەنگ ناکات**

**.. دەردە بێ وجودەکان نایەنە لاتوو باسی خۆیانیانت بۆ ناکەن**

... بای لاهوڕ پرچەکانت ناژاکێنێ

ئەبێ ئێستا تۆ چۆن بیتوو من ملی کەم ڕێ بگرم

ئێخەی کەم دەرد بگرمو

، بەدزی تۆوە شەڕی پێ بفرۆشم

دەم هەوێ بە هەموو یەقینمەوە بڵێم

... خۆشم دەوێت

دەترسم لەم شەو ڕۆژانەی باز بەسەر تەمەنمدا

هەڵ دەدەن

وەک دواکەوتویەک پێشیان دەکەوەم

وەک ماسی گرەیەک قولاپەکەم لە تەمەنم گیر دەکەم

"ئازیزم"

دیوتە کەژنانی شار چلۆن راخەرەکان دەتەکێنن

.. ئاوا من ژیانی خۆمم تەکاند

دیوتە دایک چەن خەمی نەوەکەیەتی

... ئاوا خەمی تۆمە

وەرە با ئازاد بێ ئەم ڕۆحە

وەرە با پێکەوە بژین با میهرەبانترین خانمی

.. شار هاوسەرم بێ

تۆ بژی با بت نوسمەوە

تۆ بژی کە میرات گری جوانی تۆیت

با جوانی لەیاد نەچێ

با من هەمیشە دڵ خۆش بم

با تاریکی شەو وجودی نەبێ

تا دنیا هەمیشە خۆرهەتاو بێ

........... تۆ بژی

---

**ئەم قەصیدەیە تایبەتە بە کەسێک**

**...... بۆ ئەو نوسراوە**

**-----------------------------------------------------------------**

**لە نوسینی ئیدە پاتۆ**